زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەڵقەی سێزدەهەم

# حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە

## هەڵسەنگاندنێک

عەلی باپیر



التفسير

# حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێک

## عەلی باپیر

چاپی یەکەم



ناوی کتێب: حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێک
نوسەر: عەلی باپیر
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
نەخشەشازی ناوەوە: عزالدین محمد عمر
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم 1432ك – 2011ز
تیراژ: 1500 دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (61)ی ساڵی (2011)ی پێی دراوە

تفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

چاپکردنی پێشووی کتێبەکانی بە نۆرە بە گوێرەی

توانا و هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .

وە ئێستا بوو هیوام وابوو شێوەی چاپکردنێکی

وایان بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەران بێ . جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم لە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵسێ.

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان

بێت هەمیشە سوپاسیان دەکەم .

عەلی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وعلى آله

بەندە (عەلی باپیر) بەڕێز مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و هێزی زیاتر

بخاتە ئیش و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی تر مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نییە.

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

# نێـوەڕۆك



مِنَ ﴿ وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ أَكۡبَرُ البقرة .

# پێشکەش بێ

بەوانەی کە هەوڵدەدەن بەوردو قووڵیی لە حوکم‌و بڕیارەکانی شەریعەت تێبگەن‌و نە لێیان تێپەڕێنن‌و نە لێشیان بەجێ بمێنن.

# پێناسـه‌ی ئه‌م نامیلکـه‌یه

خوێنه‌ری به‌ڕێز !

ئه‌م نامیلکه‌یه‌ی به‌رده‌ستت له‌ ئه‌ سڵدا دوو ئاڵقه‌ی به‌رنا مه‌ی ( سه‌رنج) بووه، كه له كه‌ناڵی ئا سمانی ( په‌یام)دا پێ شكه‌ش ده‌كرێ، به‌ناوونیشانی: (ئیسلام‌و ده‌وڵه‌تداریی‌و حوكمڕانیی) كه پاش هێنرا نه سه‌ر كا غه‌زو چاوپێداگێڕانه‌وه‌ی خۆم به‌م شێوه‌یه‌یان لێهاتوه.

شایانی باسیـ شه كه ئێ مه مه سه‌له‌ی: ( له ئیـ سلام هه‌ڵگه‌ڕا نه‌وه)مان له نـ ێو با به‌تی: ( ئازادیی دیـ نداریی‌و بـ یروڕا ده‌ر بڕین)دا خـ ستۆته ڕوو، له ز نجیره و تاری: (ئیـ سلام‌و ده‌وڵه‌تداریی....)دا، وه (ئازادیی دیـ نداریی‌و بیروڕا ده‌ر بڕین)یش له نێو بابه‌تی: (دابینكرد نی ماف‌و ئازادیـ یه‌كان) دا كه ئه‌میش له‌و لێكۆڵینه‌وه یه‌ی ئێ مه‌دا (حه‌و ته‌مین بـ نه‌مای سیـ سته‌می حوكمڕانیی ئیسلامیی)ه.

دیاره مه‌سه‌له‌ی: (حوكمی له ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕا نه‌وه)ش یه‌كێكه له مه‌سه‌له زۆر هه‌ستیاره‌كان‌و له را بردوو ئێستا شدا مـ شتومڕو قسه‌وبا سی زۆری له‌باره‌وه كراوه‌و ده كرێ‌و، مـ نیش به ئه‌ركی سه‌رشانی خۆمم زانی كه ئه‌و قه‌ناعه‌ت‌و تێگه‌یشتنه‌ی له‌وباره‌وه

پاش سەرنجدانو لێوردبوو نەوەو تێفکری نی زۆری قور ئانو سوننەتو ئیجتیهادو قسەو بیروڕای زانا یان، بۆم درو ستبووە ڕایبگەیەنم.

شایانی باسیشە کە هەموو ئەو بابەتو مەسەلانەی راجیاییو مشتومڕیان لەنێوان زانایا ندا لە سەر درو ستبووە، لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە دەقی شەریعەتی راستو روونو یەکلاییکەرەوەیان لەبارەوە نەهاتوون، مەبەستی شمان لە ( شەریعەت) قور ئانو سوننەتنو، مەبەستیشمان لە (راست- صحیح) بوونی دەقەکانی شەریعەت، دڵنیابوونما نە لە (وە حی) بوونـ یان لە رووی سەنەدەوە، کە دیارە ئایەتەکانی قوڕئان هەموویان وان، بەڵام دەقەکانی سوننەت جۆراو جۆرنو موتەواتیرو راستو باشو بێهێز (المتواتر والصحیح والحسن والضعیف)یان لە نێودایە.

وە مەبەستمان لە (ڕوون- واضح) بوونی دەقەکانی شەریعەت، ڕۆشنو ئاشکرابوونی واتاو چەمکەکانیانە، کە دیارە لەو رووەوە ئایەتەکانی قورئانو چ دەقەکانی سوننەتیش، جۆراوجۆرنو بە گشتی دابەش دەبن بۆ مانا ڕوونو ئاشکرا (محکم)و مانا ناڕوونو وێکچوو (متشابە).

وە مەبەستیـ شمان لە:(یەکلاییـ کەرەوە- حا سم) بوونی دەقەکانی شەریعەت، ئەوە یە کە و ێڕای ما نا رۆ شنبوونیان،

لەبارەی حوکمی ئەو مەسەلەیەشەوە کە لەبارە یەوە هاتوون، کە ئایا دەکەوێتە خانەی کام لە پێنج حوکمە گشتییەکانەوە، (ڕەوایی، پێویستێتی، پەسندیی، قەدەغەیی، ناپەسندیی: الإباحة، الوجوب، الإ ستحباب، الحر فة، الكرا هة) یەکلایی کەرەوە بن‌و نوخ تە بخەنە سەر پیت.

بۆ یە هەرکە سێك لە تێگەی شتنی قور ئان‌و سوننەت‌و چۆنیەتی ئیجتیهاد تێدا کردنیا ندا قووڵ بووبێتەوە، بە ڕێزو سینە فراوانی یەوە تەما شای ڕاجیایی زانا یان دە کات‌و هەر لە ڕ ێوە بڕ یاری حازربەدە ستیان بۆ نادات، هەر چەندە لە گەڵ قەنا عەت‌و بیروڕای ئەویش نەگونجێن، ئەوەتا پێ شەوایەکی ناوداری وەك (ئیبن تە یمییە) خوا لێی خۆشبێ، کە زۆر ترین تێکگیرا نی لە گەڵ زا ناو پێ شەوایانی ڕۆژ گاری خۆی‌و ڕۆژ گاری پێش خۆیشیدا هەبووە، لە سەر چەند مە سەلەیەك کە بیروڕاو قەنا عەتی تێیا ندا لە زۆر بەی زانا یان جیاواز بووە، وەك بەرگریکردن لە هەڵوێ ستی زانا یان کە بەبێ بەڵگەو پا ساو ڕاجیایی (إ ختلاف) یان لەبارەی با بەت‌و مە سەلە م شتومڕ هەڵگرەکا نەوە نەبووە، نامیلکە یەکی نوو سیوە بەناوونیشانی (ر فع ا لملام عن الأئمة الأعلام) وا تە: (لادا نی لۆ مەو گ لەیی لە پێشەوایانی ناودار).

ئاشكراشه كه بێجگه له قورئان‌و سوننه‌ت، هیچ شتێكی دیكه به ئاینێكی پابه‌ندكه‌ر (دینٌ مُلْزِم) دانانرێ‌و بیروڕاو ئیجتیهادی زاناو پێ شه‌وایانیش له‌باره‌ی ئه‌و با به‌ت‌و مه سه‌لانه‌وه كه ڕاجیایی هه ڵده‌گرن، له كات‌و شوێن‌و ژینگه‌یه كه‌وه بۆ یه‌كی دیكه گۆڕانیان به‌سه‌ردا دێ‌و ته‌نیا راستییه ڕه‌ها یه‌كان (الحقائق المطلقة) چه‌سپاوو نه‌گۆڕن.

منیش له لێكۆڵینه‌وه‌مدا له‌باره‌ی ئه‌م مه سه‌له‌یه هه ستیاره‌وه تاكه مه‌به‌ستم ئه‌وه‌بووه كه حوكمی شه‌رعیی راست‌و دروستی بخه مه‌ڕوو و سه‌رجه‌م ئه‌و ده‌قا نه‌ی قور ئان‌و سوننه‌ت كه له‌وباره‌وه هاتوون‌و سوننه‌تی كرده یی پێغه‌م به‌ر ﷺ، به‌شێوه‌یه‌ك كه هیچ جۆره تێكگیران (تصادم)و پێكه‌وه دژبوون (تناقض)ێك یان له نێوا ندا نه‌بێ، پێكه‌وه كۆبكه‌ینه‌وه، چونكه پێموایه ئه‌و رایه‌ی كه ده ڵێ: حوكمی له ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕا نه‌وه (حكم الإرتداد عن الإسلام) له هه‌موو حاڵاندا بریتییه له سزادانی بابای هه‌ڵگه‌ڕاوه، به كوشتن، هه‌رچه‌نده كاتی خۆی‌و ئێستاش رای زۆربه‌و جه‌ماوه‌ری زانایانه، به‌ڵام ده‌بێته مایه‌ی تێكگیران‌و پێكه‌وه دژبوونێكی گه‌وره له نێوان: قور ئان‌و سوننه‌تی كرده یی پێغه‌م به‌ری خوا ﷺ له لا یه‌ك‌و هه ندێك فه‌رمایشتی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ، له‌لایه‌كی دیكه‌وه، بۆیه ئه‌وه پێویستی به لێكۆڵینه‌وه‌و چاره‌سه‌ر هه‌یه، چونكه مه‌حا ڵه قورئان‌و سوننه‌ت

یان راستتر بڵێین: قورئانو سوننەتی کردەیی‌و، هەندێك دەقی سوننەت پێکەوە دژو ناکۆك بن، پێ شموایە ئێمە زۆر باش ئەو ئامانجو مەبەستەمان پێکاوەو هێناوەتە دی، لەپێشەوەش دەڵێم: سوپاسی هەرکەسێك دەکەم، کە بە ڕەخنەو تێبینی یەکی دڵسۆزانەی خۆی بەهرەمەندم دەکات.

والسلام علينا وعلى عباد الله الصالحين.

نووسەر

13 ذي الحجة

1431 ك

2010/11/19ز

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله و صلوات الله و سلامه وبركا ته على ر سول الله محمد وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه.

لەم نامیلکه یەدا لە دوو بڕ گەدا با سی ئازادی بڕواهێ نان و هەڵبژاردنی ئایین دەکەین، لە بڕگەی یەکەمیاندا ئازادیی مرۆڤ لە بڕواهێ نان و هەڵ بژاردنی ئایی ندا دەتوێژی نەوە، لە بڕ گەی دووەمیشدا ئازادیی مرۆڤ لە وازلێهێ نانی ئای ین و بڕوانەهێنا ندا دەتوێژینەوە.



سەرەتا دێینە سەر **بڕگەی یەکـەم:**

## ئازادیی مرۆڤ لە بڕواهێنان و هەڵبژاردنی ئاییندا

دیارە مەبەستمان لە بڕواهێنان، بڕواهێنانە بە هەر شتێك كە ئینسان وەك عەقیدە هەڵیدە بژێرێ، مەبەستیشمان لە ئایین، هەر بەرنامەیە كە كە ئینسان بۆ ژیانو گوزەرانی تاكییو خێزانییو كۆمەڵایەتییو سیاسیی خۆی پەسەندی دەكات، واتە مەبەستمان لە بڕواهێنان، تەنیا بڕواهێنان نییە بەوە كە لە ئیسلامدا كە دەبێ بڕوای پێ بهێنرێ، واتە تەنیا مەبەستمان عەقیدەی ئیسلامیی نیە، مەبەستیشمان لە ئایین تەنیا ئایینو بەرنامەو ڕێبازی خوای پەروەردگار نیە كە ئیسلامە، بەڵكو مەبەستمان گشتییە، ئینسان هەر عەقیدەیەك هەڵبژێرێ، وە هەر بەرنامەیەك هەڵبژێرێ، ئازادە، با سەرنجی چەند ئایەتێكی قورئان بدەین، كە خوا (سبحانە وتعالی) لە قورئانی بەهێزو پیرۆزی خۆیدا زۆر بەڕوونو ڕاشكاویی ڕایگەیاندوە كە مرۆڤی ئازاد كردوە لە هەڵبژاردنی هەر جۆرە ئیمانو عەقیدەیەك، وە لە هەڵبژاردنی هەر جۆرە بەرنامەو ڕێبازێكدا كە پەسەندی دەكات، بۆ وێنە: لە ئایەتی ژمارە (29)ی سوورەتی (الكهف)دا خوا (سبحانە وتعالی) دەفەرموێ: مِنَ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ

فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ...﴿٢٩﴾ أَكَبَرُ، دیارە رووی دواندنی لە پێغەمبەری کۆتایی (موحەممەد)ە ﷺ واتە: وە بڵێ حەق لە پەروەردگارتانەوەیە، جا کێ حەزدەکا با بڕوا بێنێ، وە کێش حەزدەکا با بڕوا نەهێنێ، کەواتە: خوا (سبحانە وتعالی) مرۆڤی سەرپشك کردوە لە نێوان بڕواهێنان و بڕوانەهێناندا، لە نێوان بوون بە بڕوادار (مؤمن) بە زاراوە ئیسلامییەکەی و بوون بە بێبڕوا (کافر)دا.

وە لە ئایەتی ژمارە (256)ی (البقرة)دا خوا (سبحانە وتعالی) دە فەرمویٚ: مِنَ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ ...﴿٢٥٦﴾ أَكَبَرُ، واتە: ناچاریی کردن و زۆرلێکردن لە ئایینندا نیە، ڕێی ڕاست و ڕێی چەوت لێك جیابوونەتەوە، واتە: لە سۆنگەی ئەوە کە ڕێی ڕاست دیارەو ڕێی چەوت دیارە، لەبەر ئەوە پێویست ناکات هیچ کەس ناچار بکرێ، کە ڕێی ڕاست بگرێ، ڕێی ڕاست کە لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا خۆی دەنوێنێ و، ڕێی چەوتیش بریتیە لە غەیری ئیسلام.

وە لە ئایەتی ژمارە (99)ی سوورەتی (یونس)دا خوا (سبحانە وتعالی) دە فەرمویٚت: مِنَ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ أَكَبَرُ، واتە: وە

ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، هەر چی لە سەر زەوی یە تێکڕا بڕوایان دێنا، جا ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەكەی تاكو بیانكە یە بڕوادار!!، وا تە خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی مرۆڤەكانە، بەڵام نەیویستوە بەزۆر ئیمانیان پێ بێنێ، ئایا تۆ ( ئەی موحەممەد ﷺ كە ڕەوا نەكراوو پێغەمبەری خوای وە تۆش بەندەیەكی خوای) دەتەوێ بەزۆر بیانكەی بە بڕوادار لە حاڵێكدا كە خوا خاوەن و پەروەردگاریانەو زۆری لێنەكردوون؟! واتە: بۆت نیە.

وە لە ئایەتی ژمارە (125)ی (النحل)دا خوا (سبحانه وتعالى) دە فەرموێ: مِنَ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ...أَكۡبَرُ، واتە: بانگەواز بكە بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت بە حیكمەت (وا تە: بە لێزانیی و بە كارامەیی)و بە ئامۆژگاریی چاك و بە چاكترین شێوە وتووێژیان لەگەڵدا بكە، كەواتە: خەڵك هێنان بەرەو خواو بەرەو ڕێبازی خوا، تا كە شێوازو ڕێبازی بریتە یە لە بانگەوازكردنیان بە حیكمەت و بە ئامۆژگاریی چاك و بە چاكترین شێوازی وتووێژ.

وە لە سوورەتی (الكافرون)دا خوا ( سبحانه وتعالى) دیسان پێغەمبەری كۆتایی خۆی (موحەممەد) (عليه الصلاة والسلام) دەدوێنێ و دەفەرموێ:

كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ مِنَ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ أَكْبَرُ الكافرون، **واته: به‌ناوی خوای به‌به‌زه‌یی به‌خشنده، بڵێ ئه‌ی بێ بڕوایه‌كان! ئه‌وه‌ی ئێوه ده‌یپه‌رستن من نایپه‌رستم ئه‌وه‌ی منیش ده‌یپه‌رستم ئێوه نایپه‌رستن، وه ئه‌وه‌ی ئێوه په‌رستووتانه من نه‌مپه‌رستوه، وه ئه‌وه‌ی منیش په‌رستوومه ئێوه نه‌تانپه‌رستوه، به‌رنامه‌ی خۆتان بۆ خۆتان و به‌رنامه‌ی خۆشم بۆ خۆم.**

**كه‌واته: ئیسلام زۆر به ڕوون و ڕاشكاویی كه‌سانێك كه به بێبڕواو كافریان له‌قه‌ڵه‌م ده‌دا، مافی ئه‌وه‌ی پێداون، كه ئایینی خۆیان بۆ خۆیان بێ، به‌رنامه‌ی خۆیان كه هه‌ڵیده‌بژێرن، هی خۆیان بێ، وه زۆریان لێ نه‌كرێ له گۆڕینی ئه‌و ئایین و به‌رنامه‌یه‌دا كه هه‌ڵیانبژاردوه.**

**وه هه‌ر له سووره‌تی (یونس) له ئایه‌تی ژماره (108)دا، خوا (سبحانه وتعالى) ده‌فه‌رموێت:** مِنَ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا

يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٍ أَكْبَرُ، وا تە: ب لێ ئەی خەڵکی نە! لە پەروەردگارتا نەوە حەقتان بۆ هاتوە، جا هەرکە سێك ر ێی را ست ب گریٚ، بۆ خۆی ڕ ێی را ستی گر توەو قازانجەکەی بۆ خۆیەتی، وە هەرکەسێ گومڕا بێ، ئەوە بۆ خۆی گومڕا بووەو زەرەری گومڕابوونەکەی بۆ خۆ یەتی و من بە سەر ئ ێوەوە وەکیل‌و چاودێر نیم (تاکو نەهێڵم لا بدەن وە بە زۆر رووتـان پێ وەرسووڕێنم بەرەو راستە شەقامی خوا، بەڵکو خوا سەرپ شکی کردوون، وە م نیش بۆم ن یە ئەو مافی سەرپ شك بوونەتان لێ زەوت بکەم).

وە لە بڕگەی (25)ی (الصحيفة)دا، واتە ئەو (وثيقة)یەی کە پێغەم بەر (عل یە ال صلاة وال سلام) پاش نی شتەجێبوونی لە مەدینەو دامەزراندنی دەو ڵەت‌و قەوارەی ئیسلامیی، لە ن ێوانی خۆی‌و م سوڵمانان لە لا یەك‌و جوولەکەکا ندا لە لا یەکی دی کەو هاوبەشدانەرەکان لە لایەکی دیکەوە، نووسی، لە بڕ گەی (25)دا هاتوە: "لليهود دينهم وللمسلمين دينهم مواليهم وأنفسهم"، وا تە: جوولە کەکان دی نی خۆ یان بۆخۆ یان م سوڵمانایش دی نی خۆ یان بۆخۆیان، هەم ئەوا نەی کە پێیا نەوە پەیوە ستن‌و لا یەنگرایانن، هەم خۆشیان، کەواتە: لەم ئایەتانەدا، وە لەو دەقەی (ال صحيفة)دا کە لەجێی دەستوور بووە، زۆر بە ڕوون‌و ڕا شکاویی راگە یەنراوە، کە لە دەوڵەتی ئیسلامییداو لە شەریعەتی ئیسلامدا، دان هێ نراوە

بەوەدا کە ئینسانەکان ئازادن لە بڕوا هێنان‌و لە هەڵبژاردنی ئەو ئایین‌و بەرنامەیەدا کە خۆیان پەسەندی دەکەن.

بڕگــەی دووەم:

## ئازادیی مرۆڤ لە وازلێهێنان‌و گۆڕینی ئاییندا

ئە مەیان زانا یان لە کۆن‌و هاو چەرخ، لە پێ شین‌و پا شین، مە شتومڕو وتوو یێژی زۆر یان لە سەری هە یە، وا تە: ئا یا مرۆ ڤی مە سوڵمان پاش ئەوەی ئیعلا نی مە سوڵمانەتیی خۆی دە کا، بۆی هە یە بە هەر هۆیە کەوە بێ، واز لە ئی سلام بێ نێ‌و ئایین‌و فیکرەیەکی دیکە هەڵبژێرێ؟ د یارە زۆر بەی هەرە زۆری زانا یان رایان وابووە، کە مسوڵمان بۆی نیە لە ئیسلام هەڵگەڕێ تەوە، وە هەر کاتێکیش لە ئی سلام هەڵگەڕا یەوە، سزای هەڵگەڕا نەوە (عقو بة الإر تداد)ی بە سەردا دەچە سپێنرێ، کە بریت یە لە کوشتن، وە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگە دێ نەوە، کە دەفەرموێ: (مَنْ بدّل دینه فاقتلوه)، واتە: هەرکەسێك ئایینی خۆی گۆڕی بیکوژن، کە (بخاري) و (أ صحاب السنن) هێناویا نە، بەڵام هە ندێك لە زانا یان هەم لە پێ شین‌و هەم لە هی هاوچەرخیش، بەڵکو زۆر ێك لە زانا یانی هاو چەرخ، پێ یان وا یە

كه‌ ته‌نیا به‌ له‌ ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ مرۆڤ ناكوژرێ، واته‌: ته‌نیا مرۆڤ به‌هۆی ئه‌وه‌وه‌ كه‌ له‌ ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕاوه‌ ته‌وه‌و وازی لێهێناوه‌ ناكوژرێ، چونكه‌ ئه‌وه‌ پێچه‌وانه‌ی ئازادیی بڕواپێهێنان و دینداری یه‌، وه‌كو له‌ بڕگه‌ی پێشوودا خستمانه‌ڕوو، وه‌ چه‌ندان ئایه‌تمان له‌سه‌ر هێنانه‌وه‌، جا ئێمه‌ سه‌ره‌تا به‌ڵگه‌كانی ئه‌وانه‌ كه‌ زۆربه‌ی زانایان بوون له‌ ڕا بردوودا، وه‌ زۆرێك له‌ زانایانیشن له‌ ئێستادا، به‌ڵگه‌كانی ئه‌وان دێنینه‌وه‌، كه‌ ده‌ڵێن: ئینسان دوای ئه‌وه‌ی ئیعلانی مسوڵمانه‌تی خۆی ده‌كا، بۆی نیه‌ له‌ ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕێته‌وه‌، وه‌ هه‌ر كاتێكیش هه‌ڵگه‌ڕایه‌وه‌، هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌كه‌ی به‌ تاوانێك داده‌نرێ، كه‌ له‌ سه‌ری دوو چاری سزای كوشتن ده‌بێته‌وه‌، سه‌ره‌تا به‌ڵگه‌كانی ئه‌وان دێنینه‌وه‌، پاشان به‌ڵگه‌كانی ئه‌وانه‌ی كه‌ رایان پێچه‌وانه‌یه‌و ده‌ڵێن: نه‌خێر ته‌نیا به‌ له‌ ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ ئینسان شایسته‌ی ئه‌وه‌ نابێ بكوژرێ و وه‌ڵامی ئه‌وانیش بۆ به‌ڵگه‌كانی ئه‌مان ده‌خه‌ینه‌ڕوو.

## یه‌كه‌م: به‌ڵگه‌ی ئه‌وانه‌ی كه‌ رایان وایه‌ سزای هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ له‌ ئیسلام كوشتنه‌:

ئه‌وانه‌ چه‌ند شتێك به‌ به‌ڵگه‌ دێننه‌وه‌:

یه‌كه‌م: ئه‌و فه‌رمایشته‌ی پێغه‌مبه‌ره‌ ﷺ كه‌ ده‌فه‌رموێ: (( مَنْ بَدَّلَ دينه فاقتلوه))، واته‌: هه‌ركه‌سێك ئایینه‌كه‌ی خۆی

گۆڕی بیـ کوژن، کە هەر کام لە بو خاریی‌و موسـ ـلیم‌و نە سائیی‌و ئەبوداوودو ترمیز یی‌و ئی بـن ما جەو ئە حمەد گێڕاویانەتەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ.

دووەم: بەڵگە یەکی دی کەیان فەرمای شتێکی دی کەی پێغەمـ بەرە ﷺ کە دەفەرموێ: "لا يـحل دم امريء مسلم إلا بإحدى ثلاث: الثـ يب الزا ني، وا لنفس بالنفس، والـ تارك لدي نه الـمـ فارق للجماعة". رواه البخاري ومسلم، واتە: خوێنی هیچ ئینـ سانێکی مسوڵمان بە یەکێك لە سێ شتان نەبێ حەلاڵ نا بێ، (وا تە: دروست نیە بکوژرێ، مەگەر یەکێك لەو سێیانە بکات)، (الثـ يب الزانی) کەسێك هاو سەری هەبووبێت‌و زیـناى کرد بێ، (و شەی ثیب- لە عەرەبییدا بێوەژن‌و بێوە پیاو دەگرێتەوە) (والنفس بالنفس) وە کەسێك کەسێکی کوشتبـێ بە ئانقە ست بەنا حەق (والتارك لدينه الـمفارق للجماعة) وە وازهێـنەر لە ئاینە کەی‌و جیابووەوە لە کۆمەڵی موسـڵمانان.

سێیەم: بەڵگەی دیـکەیان فەرمایـشتێکی دیـکەی پێغەمـبەرە ﷺ کە بەم شێوەیە: ((عن أبي موسى الأشعري -رضي الله عنه- أن النبـي ﷺ قال له اذهب إلـى اليمن ثم أتبَعهُ مَعاذ بن جـبل -رضي الله عنه-، فلما قَدِمَ عليه ألقى له وسادةً وقال له انـزل، وإذا رجل عنده موثق قال له ما هذا؟! قال كان يهوديـاً فأسـلم

ثم تـهوّد، قال: لا اجـلس حـتى يقـتـل، قـضاءُ الله ور سوله)) متفق عليه. له ئەبوو مووسای ئەشعەریی -رەزای خوای لێبێ- گێڕڕاوه تەوه کە پێغەمبەر (علـيه الـصلاة والـسلام) پـێی فەرمووه بڕۆ بۆ یەمەن، پاش ئەوەی کە ئەبوو موو سا بەڕێکەوت بە دوای ئەودا موعاذی کوڕی جەبەلیشی نارد - خوا لێی رازی بێ-، جا دوای ئەوەی کە موعاذی کوڕی جەبەل چوو بۆ لای ئەبوو موو سا، ئەبوو موو سا دۆشەکەڵەیەك بەڕەیەکی پـێدا کە لەسەری دابنیشێ (وەکو ڕێزلێگرتن)، وتی: دابەزە، موعاذ سەرنجیدا پیاوێك بەسترابۆوه (کەلەبچە کرابوو) لەلای ئەبوو موسا، وتی: ئەوه چییە؟! وتی: ئەوه جوولەکەیە کە مسوڵمان بوو دوایی بۆتەوه بە جوولەکە، موعاذ گوتی دانانیشم هەتاکو نەکوژرێ، ئەوه بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەیەتی.

بەڵێ ئەوان ئەم سێ فەرموودەیە بە بەڵگە دەهێننەوە، لەسەر ئەوە کە سزای لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە بریتییە لە کوشتن، یانی: ئینسان دوای ئەوەی دێتە نێو ئیسلامەوە، بۆی نییە لێی هەڵبگەڕێتەوەو هەر کاتێك هەڵگەڕایەوە دووچاری سزای کوشتن دەبێتەوە.

<u>دووەم: بەڵگەکانی ئەوانەی کە رایان وایە تەنیا بە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە مرۆڤ ناکوژرێ:</u>

ئێستاش دێینه سه‌ر باسی به‌ڵگه‌كانی ئه‌وانه‌ی كه پێیان وایه ته‌نیا به له ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه مرۆڤ ناكوژرێ، واته: واز له ئیسلام هێنان پاش بڕوا پێهێنانی تاوانێك نیه، كه سزای كوشتنی له‌سه‌ربێ، تاوانه، به‌ڵام سزاكه‌ی دونیایی نیه كه بریتی بێ له كوشتن، به‌ڵكو سزاكه‌ی قیامه‌تییه، جا دیاره من خۆم ئه‌م رای دووه‌مه‌م پێ په‌سه‌نده‌و به‌هێزه، وه پاش توێژینه‌وه‌و لێكۆڵینه‌وه‌و تێوه‌ڕامانی زۆر له ئایه‌ته‌كانی خوای په‌روه‌ردگارو له فه‌رمایشته‌كانی پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام)و له قسه‌ی زانایان، ئه‌م به‌ڵگانه‌م كه‌وتوونه به‌ر چاوو كه پشتگیریی ئه‌و رایه ده‌كه‌ن كه ده‌ڵێ: ته‌نیا به‌وه كه ئینسان له‌ئیسلام هه‌ڵده‌گه‌ڕێته‌وه، سزای كوشتن رووی تێناكات، به‌ڵگه‌كانیش سێ به‌ڵگه‌ی سه‌ره‌كیین:

<u>به‌ڵگه‌ی یه‌كه‌م</u>: هه‌بوونی چه‌ندان ئایه‌ت له‌وباره‌وه، كه خوا (سبحانه وتعالی) به‌نده‌كانی خۆی ئازادو سه‌رپشك كردوه له‌نێوان ئیمان‌و كوفر، یان سوپاسگوزاریی‌و سپڵه‌ییدا، به‌ڵێ چه‌ندان ئایه‌تمان هه‌ن، كه خوا (سبحانه وتعالی) مرۆڤه‌كانی ئازاد كردوه‌و سه‌رپشكی كردوون‌و مافی هه‌ڵبژاردنی پێداون، كافر ده‌بن، یاخود مسوڵمان ده‌بن، هه‌ڵبه‌ته خوا (سبحانه و تعالی) ڕایگه‌یاندوه كه ئیمانی پێخۆشه‌و ڕقی له كوفره، سوپاسگوزاریی پێخۆشه‌و ڕقی له سپڵه‌ییه، وه‌كو ده‌فه‌رموێ:

مِنَ ... وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ ...﴿٧﴾

أَكۡبَرُ الزمر، خوا کوفر بۆ بەندەکانی پەسەند ناکا، (یانی: پێی خۆش نیەو رازی نیە)، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزار بن (ئیمان بێنن)، لێتانی پەسند دەکات، بەڵام ئەوە مەسەلەیەکە، وە سەرپشککرانی مرۆڤ لەلایەن خواوە بە مەبەستی ئەوە کە تاقی بکاتەوە مەسەلەیەکی دیکە یە، واتە کە دەڵێین: خوا (سبحانه وتعالی) مرۆڤەکانی سەرپشك کردوە، ئیمان بێنن یا نەهێنن، مانای وا نیە کە خوا جیاوازیی نەخستۆتە نێوان ئیمانو کوفرەوە! نەخێر، بەڵکو خوا فەرمانی بە ئیمان کردوە، فەرمانی شەرعیی، وە رایگەیاندوە کە ئیمانی خۆش دەوێو ئیماندارانی خۆش دەوێ، وە ڕقی لە کوفرەو ڕقی لە کافرانە، بەڵام بە مەبەستی تاقیکردنەوە، مرۆڤەکانی ئازاد کردووەو سەرپشکی کردوون، لە نێوان ئیمانو کوفرداو زۆری لێ نەکردوون، ئەو ئیمانە بێنن کە لەلای پەسەندو خۆشەویستە، وە واز لەو کوفرە بێنن کە لەلای بوغزێنراوو ناپەسەندە، با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

1- ئایەتی ژمارە (29) سووڕەتی (الکهف) کە پێشتریش هێنامانو دەفەرموێ: مِنَ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ...أَكۡبَرُ، واتە: بڵێ حەق لە

پەروەردگارتانەوەیە، جا کێ حەزدەکا با ئیمان بێنێ، وە کێ حەزدەکا با ئیمان نەهێنێ، واتە: با بێ بڕوا بێ، یانی: وەنەبێ خوا (سبحانه و تعالی) ئیمانو کوفری پێ وەکو یەك بن، بەلاّم بەندەکانی ئازاد کردوونو ناچاریی نەکردوون، کە ئیمان بێنن.

2- ئایەتی ژمارە (99)ی سووڕەتی (یونس) کە ئەویش پێشتر هێنا مانو دە فەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای تێکڕای ئەوانەی لەسەر زەویین ئیمانیان دەهێنا، جا ئایا تۆ زۆریان لێدەکەیو ناچاریان دەکەی تاکو بیانکەیتە بڕوادار؟! واتە خوا ناچاری نەکردوونو زۆری لێنەکردوون، کە بەدیهێنەرو پەروەردگارو ڕۆزیدەرو ژێنەرو مرێنەریانە، ئایا تۆ زۆریان لێ دەکەی؟ کە بەندەیەکی وەك ئەوانی؟ دیارە بۆت نیە.

3- لە سووڕەتی (إنسان) لە ئایەتی (2و3)دا، خوا (سبحانه و تعالی) دە فەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا

﴿وَإِمَّا كَفُورًا﴾، واتە: ئێمە مرۆڤمان له نوتفەیەكی ئاوێتە دروست كردوە، تاقی دەكەینەوە، گێڕاومانە بە بیسەرو بینەر، ئێمە ڕێمان پێشان داوە، یان سوپاسگوزار دەبێ، یاخود سپڵە دەبێ، واتە سەرپشكمان كردوە له هەڵبژاردنی سوپاسگوزاریی و سپڵەییدا.

4- ئایەتی (256)ی سوورەتی (البقرة) كە تێیدا دەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ...﴾، واتە: تۆپزیی كردن نییە لە ئایینداو، واتە لە وەرگرتنی ئایینندا تۆپزیی كردن و ناچاركردن نییە.

دیارە ئەم ئایەتانە زۆر ڕوون و ڕاشكاون لەوبارەوە كە خوا (سبحانه وتعالى) بە تەواویی مرۆڤی ئازادو سەرپشك كردوە، لەنێوان هەڵبژاردنی ئیمان و سوپاسگوزاریی یان كوفرو سپڵەییدا، وە هیچ مەرج و بەند (شرط و قید)ێكیشی نەخستۆتە سەر، كە مەبەست تەنیا پێش بڕواهێنان و ئیعلانی مسوڵمانەتییە، واتە ئەو ئازادكردنەی ئینسان لەنێوان ئەوەدا، كە ئیمان بێنێ یا نەهێنێ، هیچ قەیدو بەندێك لەسەر ئایەتەكان نییە، كە تەنیا مەبەست ئەو كاتەیە پێش ئەوەی ئیعلانی مسوڵمانەتیی بكا، ئازادە، بەڵام دوای ئەوەی ئیعلانی مسوڵمانەتیی كرد ئەو ئازادییەی

لێب سه‌نرێته‌وه‌، به‌ڵكو پێش ئیعلا نی مـ سوڵمانه‌تیی‌و دوای ئیعلا نی مـ سوڵمانه‌تییش، ئایه ته‌كان موت لَه‌قن‌و به ڕه هایی هاتوون‌و هیچ به‌ندو مه‌رج (شرط و قید)ێكیان له‌سه‌ر نـ یه‌و هیچ كه‌سێ بۆی نـ یه بـلێ: مه‌به ست ئه‌وه یه كه هه‌تا دێ ته نـ ێو ئـیـ سلامه‌وه ئازاده‌، به‌ڵام كه ها ته نـ ێو ئـیـ سلامه‌وه ئازادییه‌كه‌ی لێده‌سه‌نرێته‌وه‌و له‌مه‌ودوا به‌ناچاری ده‌بێ هه‌ر مسوڵمان بێ!!

له راستییدا هیچ كام له ئایه ته‌كان ئه‌و واتا یه ناگه یه‌نن، ئینجا بێگومان كوژران له‌سه‌ر هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه له ئایین، له گه‌ڵ ئه‌و ئازادییه‌و ئه‌و سه‌رپشكرانه‌دا دژده‌وه‌ستێ، وا ته: كه سێك پاش ئه‌وه‌ی كه مسوڵمان بوو، قه‌ناعه‌تی گۆڕا، ئه‌وه به پـێی ئایه ته‌كان سه‌رپـ شكه‌، كافر ده بێ یاخود له سه‌ر ئـیـ سلام ده‌مێنێته‌وه‌، ئینجا ئه‌گه‌ر تۆ سزای بده‌ی‌و بلێی ئه گه‌ربێت‌و ئیعلانی ئه‌و قه‌ناعه ته‌ی خۆت بـكه‌ی (له حاڵێكدا كه د ڵی گۆڕاوه‌و بڕوای به ئیسلام نه‌ماوه‌) ئه‌وه تۆ دوو چاری كو شتن ده‌بیته‌وه! مانای وا یه پێ چه‌وانه‌ی ئا یه‌تی خوا ها ته‌دی، كه بریت یه له نا چاركردن‌و زۆرلێ كردن (الإ كراه والإجـ بار) له حاڵێكدا، كه خوا هه‌ردووكیانی قه‌ده‌غه‌كردوه‌و فه‌رموویه‌تی: ﴿...وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ...﴾ ق، وه فه‌رموو یه‌تی:

مِنَ لَآ إِكۡرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ...أَكۡبَرُ ، بەڵام تۆ زۆری لێدە کەیو دەڵێی دە بێ بە نا چاریی هەر چەندە بڕوا شت بە ئی سلام نەماوەو مـ سوڵمانیش نەماوی، بەڵام هەر دە بێ خۆت بە مسوڵمان پێشان بدەی، کە دیارە لەو حاڵە تەدا ئەو ئینـ سانە ئەوە هیچ کە مـ سوڵمانو بڕوادار نەماوە، چونکە کوفر هاتۆتە نـ ێو دڵو دەروونو قەناعەتی یەوە، بەڵام تۆ نا چاری دەکەی، کە هەرخۆی بە مسوڵمان پێـ شان بدات، وا تە: ببێـ تە مو نافیق، وا تە: وە نەبێ بەو زۆر یی لێکرد نە تۆ لەنێو ئیسلامدا بیهێڵییەوە، تازە لە باز نەی ئیـمان چووەتە دەرێو بۆ تە مـ سوڵمانێکی ڕووکە شییو ڕوا ڵەتیی، بۆ تە دە غەڵو مو نافیق لە ئەنجامی ئەو نا چارکردنەی تۆدا، وا تە جەبر لێکردنو ناچارکردنەکە نایگێڕێتەوە بۆ ئیسلام، بەڵکو دەیکا بە شتێك لە کافر خراپتـر، کە بریتیە لە مونافیق.

ئەوە بەڵگەی یەکەمی ئەوانەی کە پێیانوا یە تەنیا بە لە ئی سلام هەڵگەڕا نەوە ئینـ سان سزای کو شتنی بە سەردا ناچە سپێ، بۆ یەش هەموو جارێ دەڵێـ ین: تەنیا بە لە ئی سلام هەڵگەڕا نەوە مرۆڤ بە کو شتن سزا نادرێ، چونکە وێڕای هەڵگەڕانەوە لە ئی سلام، دە بێ شتێکی دیکە شی بێـ تە پاڵ، ئەوجار موستەحەقی سزای کو شتن دە بێ، وە کو دوا یی باسی دەکەین.

بەلگـەی دووەم: ئەوەیە کە لە ئایە تەکانی قورئا ندا تەنیا با سی سزای رۆژی دوایی کراوە، بۆ تاوانی لە ئیسلام هەلگەڕا نەوە و باسی سزای دنیایی نەکراوە، با تەما شای ئەم ئایەتا نە بکەین کە هەموویان ئا یەتی مەدەنیین، هەڵبە تە لە ئایە تە مەککییەکانیشدا با سی هەلگەڕا نەوە لە ئیسلام کراوە، بەلام من تەنیا ئایە تە مەدەنی یەکانم هێناوە تەوە، چونکە یەکێك بۆی هەیە بلێ: جاخۆ سزای هەلگەڕانەوە لە ئیسلام لە قۆناغی مەدینەدا فەرز کراوە! لە سووڕەتی (البقرة) ئا یەتی (217)دا، خوا (سبحانە وتعالی) دە فەرموێ: ﴿... وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ...﴾، واتە: وە هەرکەسێك لە ئێوە لە ئاینەکەی هەلگەڕێتەوە وە بە کافریی بمرێ، ئەوە کردەوەکانیان هەلوەشاونەوە لە دونیاو دوارۆژدا، وە ئەوانە هاوەلی ئاگرن، وە بە هەمیشەیی لەنێو دۆزەخدا دەمێننەوە، وەك دەبینین: تەنیا باسی سزای قیامەت کراوە.

هەروەها لە سووڕەتی (محمد) ئا یەتی (25)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ

ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَـٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی پاشەوپاش هەڵگەڕانەوە دوای ئەوەی هیدایەتیان بۆ ڕۆشن بووبۆوە، ئەوانە شەیتان ئەو هەڵگەڕانەوەی بۆ جوانکردوون، وە ڕستەی بۆ درێژکردوون و هانی داون.

وە لە ئایەتەکانی (86 و87 و88)ی سوورەتی (آل عمران)دا، خوا (سبحانه وتعالى) لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: خوا چۆن ڕێنمایی کۆمەڵێک دەکات، کە پاش ئیمان هێنان کافر بوونەتەوە، وە دوای ئەوەی کە شایەتییان داوە پێغەمبەری خوا حەقە، وە دوای ئەوەی کە بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هاتوون، وە بێگومان خوا ڕێنمایی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات، ئائەوانە سزایان ئەوەیە کە نەفرینی خواو فریشتەکان و تێکڕای خەڵکییان لە سەرە لە

دۆزە خدا بە هەمیشەیی دەمێنەوە، سزایان لە سەر سووك ناکرێ، وە مۆڵەتیش نادرێن. دیسان تەماشا دەکەین تەنیا باسی سزای دوارۆژ کراوە.

وە لە ئایەتی ژمارە (90)ی سوورەتی (آل عمران)دا، دیسان خوا دە فەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی کە پاش ئیمانیان هەڵگەڕاونەتەوەو کافر بوون، وە دوایی لە کوفردا زیاتر ڕۆچوونو زیادیان کردوە، ئەوانە پەشێمان بوونەوەیان لێقبووڵ ناکرێت، وە ئەوانە گومڕاو سەرگەردانن.

وە لە ئایەتی ژمارە (74) سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾، کە دەر بارەی دڵ نەخۆشەکان، کۆمەڵێك کە هەڵگەڕاونەتەوە لە ئیسلام

دەدویٚو دە فەرمویٚ مِنَ ... يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ ...أَكۡبَرُ، واتە: سویٚند دەخۆن بە خوا کە ئەو قسەیان نەکردوە، بەلاٌم بە تەئکید وشەی کوفریان گوتوە مِنَ ... وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ...أَكۡبَرُ، وە دوای ئەوەی کە هاتوونە نیٚو ئیسلامەوە کافربوونەتەوە، (واتە: دوای ئەوەی هاتوونەتە نیٚو ئیسلام بە ڕوالٌەتیی، شتی وایان گوتوە، کە لەسەریان چەسپیوە، کە لە بازنەی ئیسلام چوونەتە دەریٚ)، مِنَ ...وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْ ...أَكۡبَرُ، وە مەبەستیٚکیشیان هەبوو دەستیان پیٚی نەگەیشت (کە زۆر لە تویٚژەرەوانی قورئان دەلٌیٚن: بریتی بوو لە کوشتنی پیٚغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام))، مِنَ ...وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦ ...أَكۡبَرُ، وە هیچ ڕەخنەشیان نەبوو، هیچ عەیبیشیان نەدۆزیەوە، ئەوە نەبیٚ کە خواو پیٚغەمبەری خوا بە چاکەی خۆیان بیٚ نیازیان کردبوون، (واتە: ئەوەبوو کە لە سایەی ئیسلامدا دەولٌەمەند بوو بوونو خوا بە بەخششی خۆی ساماندارى کردبوون و پاداشتی چاکەیان بە خراپە دایەوە)، مِنَ ...فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ

خَيْرًا لَّهُمْ ...أَكْبَرُ، ئە گەر بگەڕێنـەوەو پە شـێمان ببنـەوە واز لـ ـەو کو فـرە بێ نـن، ئەوە بۆ ئەوان باش تـرە، مِنَ ... وَإِن يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ ..أَكْبَرُ، وە ئەگەر پشت هەڵکەن خوا ئازارێکی بەئێشیان دەدا لە دونیا لە دوارۆژدا مِنَ ... وَمَا لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ... أَكْبَرُ، وە لە سەر زەوی هیچ پ شتیوان‌و هیچ یارمەتـ یدەرێکیان نـ یە، د یارە لـ ێرەدا با سی سزای بە ئێ شی دونـ یای کردوە، بەڵام سزا بەئێ شە دونیاییە کە، وە کو تو ێژەرەوانی قور ئان دە ڵێن، شتێکی د یار کراو نـ یە تاکو سزایەکی دونیایی بێ، بەڵکو ئەوەبووە کە هەمیشە لە حاڵەتی دڵەڕاو کەدا بوون، نهێنـی یەکانیان کە شف دە بن، بۆ یە خوای پەروەدگار پێغەمـبەری خۆی (علـيه الـصلاة والـسلام) ئا گادار کردۆتەوە کە ئەوان هەمیـشە لە ئازارو ئێ شێکی دەروونـی یدا ژیاون.

ئینجا ئێمە تەنیا ئایەتە مەدەنییەکانمان هێنا، ئە گەرنا لە ئایە تە مەکییەکانی شدا هەروا یە، وە کو لە ئا یەتی ژ مارە (106)ی سووڕەتی (النـحل)دا و ئا یـەتی (11)ی سووڕەتی (الحج)دا و ئایەتی (65)ی سووڕەتی (الز مر)دا، دیـسان با سی هەڵگەڕانەوە لە ئیـسلام کراوە، بەبێ ئەوەی کە با سی سزای

دونیایی بكرێ، بەڵام وەك پێشتریش گوتمان ئێمە بۆیە تەنیا ئایەتە مەدەنییەكانمان هێنان، چونكە یەكێ بۆی هەیە بڵێ: سزا شەرعییەكان هەموویان لە قۆناغی مەدینەدا فەرز كراون.

ئینجا لێرەدا دەپرسین: باشە بۆچی سزای دونیایی لە ئایین هەڵگەڕانەوە لە قورئاندا باس نەكراوە؟ كە بە حساب دەبێ بریتی بێ لە كوشتن، كە قورسترین سزایەو هیچ سزایەك بە قەدەر كوشتن قورس نییە، لە گەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو ئایەتانە باسی لە ئایین هەڵگەڕانەوە دەكەن، بەڵام بێجگە لە سزای قیامەتی، باسی سزای دونیایی نەكراوە؟! بێگومان ئەوە جێی پرسیارە، لە حاڵێكدا كە ئێمە دەبینین سزای تۆمەتی داوێن پیسیی (قذف) باسكراوە، واتە: كەسێك تۆمەتی داوێن پیسیی بۆ پیاوێ یان ئافرەتێ بكات، بێ ئەوەی بتوانێ چوار شاهیدان بێنێ، دەبێ (80) قامچی لێبدرێ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ ...﴾ النور، واتە: ئەوانەی كە ئافرەتانی داوێن پاك تۆمەتبار دەكەن بە داوێن پیسی، پاشان چوار شایەد ناهێنن (80) قەمچییان لێ بدەن، لە یەك ئایەتدا باسی سزای تۆمەتی داوێن پیسیی كراوە، كە (80) قەمچییە،

وه له یەك ئایەتیشدا باسی سزای دزیی کردن کراوه، که دەست بڕانه: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا ...﴾ المائدة، واته: وه پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن.

تەماشا دەکەین ئەم دوو سزایه که دوو سزای سووکن، بێگومان (80) قەمچی لێدران، لەگەڵ دەست بڕران، لەچاو کوشتن، دوو سزای سووکن‌و تەنیا یەکی له یەك ئایەتیشدا باسکراون، بەڵام له چەندان ئایەتدا باسی له ئایین هەڵگەڕانەوه کراوه، بێ ئەوەی که ئاماژه به سزای دونیایی بکرێ! کەواته: له ئەسڵدا له ئایین هەڵگەڕانەوه سزایەکی دونیایی لەسەر نیه، که بریتی بێ له کوشتن، له هەموو حاڵاندا، بۆیەش دەڵێم له هەموو حاڵاندا، چونکه وەکو دوایی باسی دەکەین، تەنیا له یەك حاڵەتدا سزای کوشتن ڕوو له کەسێك دەکات که له ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوه، ئەویش ئەوەیه که ئەو کەسه وێڕای له ئیسلام هەڵگەڕانەوه، بچێته ڕیزی دوژمنانیشەوەو دوژمنایەتی ئەهلی ئیسلام بکا، لەو کاتەدا خوێنی خۆی حەڵاڵ دەکات، بەڵام نەك لەبەر هەڵگەڕانەوه له ئیسلام، بەڵکو لەبەر دژایەتییکردنی بۆ ئیسلام، واته نەك لەبەر دەرچوونی له ئیسلام، بەڵکو لەبەر دەرچوونی له دژی ئیسلام، به عەرەبی دەگوترێ: (لیس لخروجه من الإسلام، بل

لخروجه على الإسلام).

بەلگەی سێیەم: هەلوەشاندنەوەی بەلگەکانیان: ئەمجار با بێینە سەر هەڵسەنگاندنی ئەو بەلگانەی کە ئەوانەی پێیان وایە سزای لە ئیسلام هەلگەڕانەوە لە هەموو حالاًندا بریتیە لە کوشتن، بۆ ئیسپاتی ڕایەکەیان دەیانهێننەوە.

دیارە وەك پێشتر باسمان کرد ئەوانە هیچ بەلگەیەکی قورئانیان بەدەستەوە نیەو تەنیا بە دەقەکانی سوننەت بەلگە دێننەوەو ئەو دەقانەی سوننەتیش کە لەوبارەوە پشتیان پێ دەبەستن، سەرجەم سێ دەقن کە لە بڕگەی یەکەمدا خستماننە ڕوو.

جا هەرچەندە ئێمە پاش تۆزێکی دیکە پێنج بەلگە لەسەر ئەوە دێنینەوە کە ناگونجێ ئەو دەقانەی سوننەتو هاوویێنەکانیان بکرێنە بەلگەی ئیسپاتی ئەوە کە بابای هەلگەڕاوە سزایەکەی بریتیە لە کوشتن لە هەموو حالاًندا، بەلاًم سەرەتا بە گشتی لەبارەی ئەو دەقانەی سوننەتەوە دەلێین: دەقەکانی سوننەت بە گشتی لە ڕووی (سَنَد)ەوە دوو جۆرن:

موتەواتیر[1] (مـتواتر)و ئاحاد (أحاد)، موتەواتیریش

---

1) السنة المتواترة: هي التي رواها جمع كثير تحيل العادة تواطئوهم على الكذب،

ئەوە یە كە ژمارە یەكی زۆر له پێغەمبەری خواوە یان گێڕابێتەوە تا كۆتایی[1].

ئا حادیش[2] ئەوە یە یەكێك یان ژمارە یەكی كەم له پێغەمبەری خوا یان گێڕابێتەوە كە هێندە نەبن هەواڵدانەكەیان بگەیەنێتە دڵنیایی[3].

هەڵبەتە تێكڕای زانایانیش لەسەر ئەوە كۆكن، كە هەواڵی تەواتور دڵنیایی (یقین) دەبەخشێ، بەڵام هەواڵی ئا حاد، تەنیا گومانی زاڵ (الظن الراجح) دەگەیەنێ.

هەربۆ یەش زانا یان لەبارەی ئەو دەقانەی سوننەتەوە كە ئا حادن، ڕاجیایان هە یە لەو بارەوە، كە ئا یا چۆن چۆنی بۆ بەلگەهێنانەوە لەسەر ئیسپاتی حوكمە شەرعییەكان مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێ، بۆ وێنە: مالیكییەكان بۆ وەرگرتنی سوننەتی

أو وقوعه منهم من غير قصد التواطوء عن جمع مثلهم حتى يصل المنقول الى النبي عليه الصلاة والسلام، ويكون مستند عملهم بالأمر المنقول عن النبي ﷺ المشاهد أو السماع. (الوجيز في أصول الفقه، د. عبدالكريم زيدان، ص168).

1) تیسیر علم اصول الفقه، ص137، عبدالله بن یوسف الجدیع.

2) الآحاد: هي ما رواها عن النبي ﷺ عددٌ لم يبلغ حد التواتر. هەمان سەرچاوە، ص171.

3) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص140.

ئا حاد، مەرجیان ئەوە یە كە پێ چەوانەی كردەوەی خەڵكی مەدی نە (ع مل أ هل المدي نة) نەبێ، وە حەنەفیەكان دوو مەرجیان هەن بۆ كارپێكردنی سوننەتی ئاحاد، یەكەم: نابێ ئەو مەسەلەیە لەوانەبێ كە خەڵكی بە گشتی پێیانەوە گرفتارن (أن لا تكون في أمر تعم به البلوى) واتە: ئەگەر لەو جۆرە بێ، عەقڵو مەنتیق وادەخوازێ كە بە تەواتور پێمان بگات، مادام وا پێماننەگەیشتبێ، جێی گومانە. دووەم: نابێ ئەوەی كە گێڕاویەتەوە لە پێغەمبەرەوە، كاری پێنەكردبێ[1].

ئینجا ئاشكراشە، كە هەركام لەو سێ دەقەی سوننەت لە جۆری ئاحادن‌و دواییش ڕوونی دەكەینەوە كە ئایا ئەو مەرجانەیان تێدا هاتوونەتە دی، یان نا؟

ئەوە لە لایەكەوە لە لایەكی دیكەشەوە دەڵێین:

بنچینەیەكی (أصول الفقه)ە كە هەركات لە بارەی مەسەلەیەكەوە دوو دەق (نص) مان هەبوون، كە یەكیان گشتی (عام)ەو یەكیان تایبەت (خاص)ە، یان یەكیان رەها (مطلق)ەو یەكیان بەنددار (مقیّد)ە، یان یەكیان كورت (مجمل)ەو یەكیان درێژ (مفصّل)ە، ئەوە پێویستە دەقە گشتی یان رەها یان كورتەكە لە بەر ڕۆشنایی دەقە تایبەت‌و بەنددارو درێژەكەدا

1) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل144- 146.

حاڵی بین، وەك گوتوویانە:

"یحمل العام علی الخاص، والمطلق علی المقید، والمجمل علی المفصل)[1].

ئینجا بینا لەسەر ئەوەی، کە ڕابرد دەڵێین:

لەبەرئەوەی فەرموودەی: ((مَنْ بدّل دینه فاقتلوه)) دەقێکی گشتییە ( عام)ەو دەقی ((لا یحِلُّ دم امرئٍ مسلم إلا بإحدی ثلاث: .... والتارك لدینه المفارق للجماعة)) دەقێکی تایبەتی (خاص)ە، چونکە لە دەقی (( من بدل دینه...))دا، هەر کەسێك ئاینی خۆی بگۆڕێ حوکمی کوژرانی بەسەردا دراوە، بەڵام دەقی ((التارك لدینه المفارق للجماعة)) حوکمی کوژرانی تایبەت کردوە بەکەسێکەوە کە ئایینەکەی خۆی دەگۆڕێو دەشچێتە ڕیزی دوژمنانیشەوەو لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیا دەبێتەوە.

وە دەشتوانین بڵێین:

لە دەقی یەکەمدا ((من بدل دینه.....))دا خودی ئایین گۆڕین بەرەهایی کراوەتە پاساو (مبرِّر)ی کوژران، بەڵام لە دەقی دووەم: ((التارك لدینه ...))دا بەند (قید)ێك خراوەتە سەر ئەو ئایین گۆڕینە ڕەهایە، کە بریتییە لە ئایین گۆڕینێك کە

---

1) بڕوانە: الوجیز في أصول الفقه، ص286و310 و352.

ئینتیماو سه‌نگه‌رگۆڕینیشی به‌ دوادا دێت‌و ئه‌و هه‌لگه‌ڕاوه‌یه‌ و یێڕای واز له‌ ئیسلام هێنان به‌ یه‌کجاری واز له‌ ڕیزی مسوڵمانانیش دێنیٚ‌و، ده‌چێته‌ ڕیزی دوژمنانیشه‌وه‌و سه‌نگه‌ر له‌ مسوڵمانان ده‌گریٚ!

که‌واته‌:

به‌ حوکمی بنچینه‌ی: (یحمل العام على الخاص)و بنچینه‌ی (یحمل المطلق على المقید) ناچارین بڵێین: مه‌به‌ست له‌و هه‌لگه‌ڕاوه‌یه‌ی که‌ خوێنی حه‌ڵاڵ ده‌بیٚ، هه‌موو هه‌ڵگه‌ڕاوه‌ (مُرتد)یێك نییه‌ به‌گشتی، وه‌ هه‌موو جۆره‌ هه‌لگه‌ڕانه‌وه‌یه‌ك خوێنی خاوه‌نه‌که‌ی حه‌ڵاڵ نابیٚ‌و، سزای کوشتنی له‌ به‌رانبه‌ردا نابیٚ به‌ڕه‌هایی، به‌ڵکو ئه‌و هه‌لگه‌ڕاوه‌یه‌ی سزای کوشتن ده‌یگرێته‌وه‌، هه‌لگه‌ڕاوه‌یه‌کی تایبه‌ت (خاص)ه‌و، ئه‌و هه‌لگه‌ڕانه‌وه‌یه‌ی سزاکه‌ی کوشتنه‌، هه‌لگه‌ڕانه‌وه‌یه‌کی به‌نددار (مقید)ه‌، که‌ بریتین له‌:

که‌سێك که‌ له‌ ئیسلام هه‌ڵده‌گه‌ڕێته‌وه‌و پاشان ده‌چێته‌ ڕیزی دوژمنانه‌وه‌و سه‌نگه‌ر له‌ ئیسلام‌و موسڵمانان ده‌گریٚ، وه‌ هه‌لگه‌ڕانه‌وه‌یه‌ك که‌ هاوڕێیه‌ له‌گه‌ڵ به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی ئیسلام‌و مسوڵمانان‌و به‌ هێز دژایه‌تیی کردنیان.

وه‌ له‌ ڕاستییدا سزایه‌که‌ له‌سه‌ر خودی له‌ ئایین هه‌لگه‌ڕانه‌وه‌که‌ نیه‌، که‌ ئه‌وه‌ مافێکه‌ خوای کاربه‌جیٚ به‌ هه‌موو مرۆڤێکی داوه‌،

وه‌ك له چه‌ندان ئا یه‌تی قورئا ندا به ڕا شكاویی ڕاگه یه‌نراوه‌، به‌ڵكو له‌سه‌ر رووبه‌ڕووبوونه‌وه‌و دژایه‌تییكردنه‌كه‌یه‌.

ئینجا ئه‌گه‌ر یه‌كێك بپرسیّ:

ئایا به‌لگه له‌سه‌ر ئه‌وه چییه كه هه‌ر كه‌سێك دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان جه‌نگی‌و سه‌نگه‌ری لێگرتن سزایه‌كه كوشتنه؟

له وه‌ڵامدا ده‌ڵێین: به‌ڵگه‌مان ده‌یان ئا یه‌تی قورئانی به‌پێزو ده‌قی سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ری به‌ڕێزه ﷺ، بۆ نموونه: مِنَ ... فَإِن قَٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ أَكْبَرُ البقرة، وا ته: جا هه‌ركات له‌گه‌ڵتان جه‌نگین‌و به شه‌ڕهاتن، ئه‌وه بیانكوژن، سزای كافران ئاوا یه‌، (وا ته: كافرانێك كه روو به‌ڕووی مسوڵمانان ده‌بنه‌وه‌).

كه‌واتـه:

فه‌رمووده‌ی: (( من بدل دينه فاقتلوه)) ده‌قێكی كورت (مجمل)ه‌، چونكه وێڕای مسوڵمانان نامسوڵمانانیش ده‌گرێته‌وه‌، كه بێگومان ئه‌وان مه‌به‌ست نین، چونكه: ئه‌گه‌ر بابا یه‌كی جووله‌كه‌، یان نه‌صرانیی یان بووذایی، یان مه‌جووسیی، ئایینه‌كه‌ی به ئیسلام بگۆڕیّ ئه‌وه ئیسلام پێشوازیی لێده‌كات، وه ئه‌گه‌ر له كوفرێكیشه‌وه بۆ كوفرێكی دیكه بگوازێته‌وه‌، ئه‌وه بۆ

ئیسلام هیچ فه‌رق ناكات!

هه‌روه‌ها ئه‌م ده‌قه‌ هه‌ر مسوڵمانێكیش ده‌گرێته‌وه‌ كه‌ به‌ هه‌ر شێوه‌یه‌ك بووه‌ له‌ ئیسلام پاشگه‌زبووه‌ته‌وه‌، كه‌ ئه‌مه‌ش راست نی یه‌، چونكه‌ خوا ( سبحانه وتعالى) له‌ چه‌ندان ئایه‌تدا رایگه‌یاندوه‌ كه‌ مرۆڤه‌كانی له‌ نێوان كوفرو ئیماندا سه‌رپشك‌و ئازاد كردوه‌، كه‌وا ته‌: مه‌به‌ست له‌و كه‌سه‌ی كه‌ ئایینه‌كه‌ی ده‌گۆڕێ‌و به‌ كوژران سزا ده‌درێ، ئه‌و مسوڵمانه‌یه‌ كه‌ وێڕای هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ له‌ ئیسلام - كه‌ ئه‌وه‌ مافی خۆیه‌تی- له‌ ریزی مسوڵمانانیش جیا ده‌بێته‌وه‌و ده‌چێته‌ به‌ره‌ (جَبْهة)ی كافرانی دژایه‌تییكه‌ره‌وه‌و سه‌ره‌نجام فه‌رمووده‌ی: ((التارك لدينه المفارق للجماعة)) ده‌بێته‌ ڕوونكه‌ره‌وه‌ی (مُبَيِّن) فه‌رمووده‌ی پێشووو درێژه‌ (مفصل)ه‌كه‌ی.

ئێستاش ئێمه‌ پێنج (5) به‌ڵگه‌ دێنینه‌وه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌، كه‌ ئه‌و فه‌رمایشتانه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه‌ به‌ به‌ڵگه‌ ده‌هێنرێنه‌وه‌، (دیاره‌ له‌وباره‌وه‌ هیچ ئایه‌تێك نیه‌و پێشتر باسمان كرد، كه‌ سزادانی هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ له‌ ئایین له‌به‌ر خودی هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌كه‌ له‌ قورئاندا باس نه‌كراوه‌و به‌س له‌ فه‌رمایشته‌كانی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ هاتوه‌)، ناگونجێ مه‌به‌ست پێ یان سزادانی دونیایی بێ، له‌ هه‌موو حاڵاندا:

<u>به‌ڵگه‌ی یه‌كه‌م:</u> له‌ ڕێیه‌كی ڕاست‌و درووسته‌وه‌ نه‌زانراوه‌، كه‌

